لە چاپخانەی (شەهاب) لە هەولێر چاپکراوە لەسەر ئەرکی
بەڕێز کاک (سۆران تاودەر) خاوەنی چاپخانە.

ناوی نامیلکە: دڵ و ژیان
ناوی نووسەر : کازم کۆیی
تایتڵەکانی بەرگ: هونەرمەندی خۆشنووس محەمەد زادە
پیتچنین : تارا تەها محەمەد سالح میکایلی
تیراژ : ٥٠٠ دانە
ساڵی ٢٠١٩
نەخشەی بەرگ وناوەوە: سۆران تاودەر
ژمارەی سپاردن: (٨٧٩) هەولێر - هەرێمی کوردستان

# وتەیەک

خوێنەرانی بەرێز.. دوای رێزو سڵاوم بۆ هەمووتان هەر ساغ وشادو بەختەوەر بن..
بەرێزان، بۆ ئامادەکردنی سەرجەم هۆنراوەکانم لە دیوانێکدا بەباشم زانی سەرەتا بەهەرشێوەیەک بێ چاپیان بکەم چونکە کۆکردنەوەیان ئاسانتر دەبێت بۆیە ئەم چەند هۆنراوە جیاجیایەش وا بە ناونیشانی (دڵ وژیان) دەخەمە بەردەستی ئێوەی بەرێز کە هەریەکەو لەکاتی خۆی لە فەیسبوک بڵاوکراونەتەوەو لێرەدا لەکاتی ئامادەکردنی بۆ چاپ دەستکاری چەند وشەیەک کراوە کە ئاوام پێ باشتر بوو بەو هیوایەی ئەگەر وشەیەک، بە دێڕێک،کۆپلەیەکیش جێگەی رەزامەندیتان بێ ئەوا جێگەی خۆشحاڵی ئێمەیە لەگەڵ رێزمدا.....هەربژین.

کازم کۆیی
٢٥/٧/٢٠١٩

## قەڵا

قەڵایــەک لــە لــم دروســـتکرابێ
چەنـدەها پاشــاو ســوپای تێـدابێ
بـۆ مرۆڤـی ژێـر جێـی ئومێد نـابێ
هــەر بیابانــە یــەک رەشــەبا بــێ

٢٠١٨/١٠/٣١

دوو سوێند بۆ پەرلـەمانتارانی کوردسـتان بۆ رۆژی ٢٠١٨/١١/٦ (یەکیان هەڵبژێرن)

## سوێندی یەکەم

سـوێند دەخـۆم بـەخوای گـەورە
بـەو کورسـیەو مووچـە چـەورە
بـــەفرە بـــارانە هـــەورە
هـــەر بمێـــنم لـــەم دەورە

# سوێندی دووەم

بەخوای گەورە سوێند دەخۆم
مافی هیچ کەسێک نەخۆم
ڕاست کار بکەم ڕاست بڕۆم
بۆگەل بسوتێم وەک مۆم
ئەگەر خۆ ویست بم خوایە
شادنەبم لەم دونیایە
خوایە گەر چاک وپاک بم
ئەستێرەی گەل و خاک بم
ئاواتەخوازم کەوا
لێم رازی بێ گەل و خوا
لەگەڵ هەق بم هەمیشە
پاکی بکەم بە پیشە
پەیمان بێ بەدڵ و بەگیان
دڵسۆزبم بۆ نیشتمان

٦/١١/٢٠١٨،٥

## پەروانەو شەم

لەدەوری شەما سەمای پەروانە
تا بڵێی دیمەنێ پڕ سۆزو جوانە
عەشقی رووناکی بێ هەستی دەکا
گڕوباڵای شەم باش مەستی دەکا
زۆرجار بێ ئاگا دەبەخشێ گیانی
لەڕێی عەشقی پاک دەبتە قوربانی
١٥/١١/٢٠١٨

## مخابن

وەتەی دەبیستم هەر سەردەکەوین
وەتەی دەبینم لە دواین دەکەوین
بۆ بەندی یەکتر قەفەس و کەوین
دەگەینە بەرزی زوو لادەکەوین
مخابن بۆچی نابێ پێشکەوین
ئێمەش وەک وڵات رۆژێ دەرکەوین
١٥/١١/٢٠١٨

## سنوور

سـەدەها سـاڵە خـاكی ئـەم وڵاتـە
بـۆ سـنووری قـایم هـەر بـە ئاواتـە
دەڵێن زۆر بـەردمان هێناوە لـەدوور
لە كوێی قایم كەین ئەری كوا سنوور

١٥/١١/٢٠١٨

## خەزان

دەیـــەها ســـاڵە لێـــرە خەزانـــە
مـــاڵ وێرانییـــەو لێـــك ترازانـــە
سـەد دەبنـە دوژمـن تـادوو یەكـدەگرن
ئەم دووەش هەردەم رێگە لێك دەگرن

١٥/١١/٢٠١٨

## گۆچان

گۆچـان مەچێنـە بـەرت بـۆ نـاگری
بیدە دەست پیری خۆی پێ رابگری
نـەمام بچێنـە هـەردەم بـێ وچـان
بەرهەمی دەبێ و دەشبێ بە گۆچان

١٥/١١/٢٠١٨

## (ماڵی ئێمە) ئەم (هەرێمە)

گوێ تەپ بوو لە درۆ بیستن چاو خێل بوو لە چاوەڕوانی
بێ ئومێد بوو دڵی داماو وێران بوو هەستی پڕ جوانی
لە شووشەی چاویلکەی پیران لەناو چاوی گەنجەکانا
هیــواو ئامــانجێ نــابینم تیشــک بەخشــێ بــە ژیانــا
دەبێ بۆ هێندە ئەستەم بێ رێکخستنەوەی ماڵی ئێمە
(هیرۆشــیما)و(ناکازاکی) ســاناتربوون لــەم هەرێمــە

٢١/١١/٢٠١٨،٢٠

## گەل و ماف

هـەزاران پۆست و ناوبانگ وکورسی
ناگاتــە ئاســتی کــوردێکی برســی
ئەو خەباتەی کورد بۆ ئێستا کردی
نــەدەبا وابــا حــەیف بــا بــردی
دارێکــی پیــری ئــەم کوردســتانە
بدوێنــە نــاخی پــڕ زام و ژانــە

ئـەی گـەر مرۆڤـێ هەسـتیار بـدوێنی
دەبـێ چۆن بـە گـوڕ رۆنـدک بڕژێنـی
بۆیــە ئــەمڕۆ گــەل مــافێکی دەوێ
کــەوا بەردەســت و چــاوی بکــەوێ
٢٣/١١/٢٠١٨

## بێ دڵی و یەک دڵی و سێ دڵی

مێشوولەی سێ دڵ مێینەی خوێن دەمژێ و نێرەی هەڵاڵە
پەپوولـەی بـێ دڵ ناسـک و قەشـەنگ شـەیدای گوڵاڵـە
مرۆڤـی بـە هەسـت خـاوەنی یـەک دڵ مانـدوو وعەوداڵـە
ژیــان ماوەیەکــەو دەمــێ شــیرینەو دەمێکــیش تاڵــە
٦/١٢/٢٠١٨

## کورسی

کۆشک و کورسـی و دەسـەڵات بۆ خزمـەتی میللەتـە
وا نـەبێ هـەنگاوت بـەرەو شـڕە کورسـی ژێر پەتـە
پشت و قاچی کورسیەکەت راگری کۆشک و قەڵات
میللەتـە میللـەت نـەبێ پووشـە کورسـی و دەسـەڵات
١٨/١/٢٠١٩

# دڵ و ژیان

کـاتێ لـه چـاڵ و تـاریکی
تۆ چەندە عەشقی رووناکی
کــه ئــاوارەو دەربــەدەری
شـێتی سـۆزو بسـتێ خـاکی
لاوبـی پیربـی بـێ نیشـتمان
وەک منــداڵێکی بــێ دایکــی
ژیان بێ نازو خۆشەویستی
هـەردەم هـیلاک و خـەمناکی
بــێ هیــوایی دەتفــەوتێنێ
لـه نـەمانی خـۆت بـێ بـاکی
حـەیف مـرۆڤ بـه دڵ نـەژی
لــه ســایەو ئــامێزی پــاکی
لـــەداخانا بـــەخۆت بڵێـــی
بەخوای هەر بۆ مردن چاکی

١٧/١/٢٠١٩

## خۆشەویستی

بگەیتـــە دڵـــێ پـــڕ خۆشەویســـتی
وابزانـــە دونیـــات هاتۆتـــە دەســـتی
بـــێ ئۆتۆمبێـــل و فرۆکـــەو کەشـــتی
لـــەناو جیهانـــای هـــەردەم لـــە گەشـــتی

٥/٢/٢٠١٩

## خەندەو خەزان

خەنـدەی لێـو هیچـە گـەر بـەدڵ نـەبێ
بـــەهار خەزانـــە چـــاوی گـــوڵ نـــەبێ
دەڵـــێن چـــاوی تـــۆ چەشـــنی چرایـــە
نـــازانن گـــڕی ســـینەی ســـووتایە
بولبـولی هەسـتیار لەگـەڵ قـەل بـژی
ئـەم دڵـە ناسـکە چـۆن خـەم نـایکوژی
تەمـــەنی مـــرۆڤ بـــۆ خۆشـــی و چێـــژە
حەیفـــە ســـەرو دڵ لێـــرە هـــەر گێـــژە
ئەگـــەر خـــۆت دڵـــی خـــۆت نەدەیتـــەوە
شـــەوانیش بـــێ خـــەو ڕۆژ دەکەیتـــەوە
تەمـــەنیش دەڕوا بـــۆ تـــۆ ناوەســـتێ
تـــا لـــەناکاوا دڵـــت دەوەســـتێ

٥/٢/٢٠١٩

# بێ دەنگە پڕ هاوارەکان

ئەوانەی مات و بێ دەنگن
بەهادارو شا فەرهەنگن
بێ دەنگیان پڕ لە هاوارە
هاوار لە چاوانیان دیارە
ئاخ کەم لە فەرهەنگ دەڕوانن
نرخی بێ دەنگی دەزانن
تا فەرهەنگ نەبێ بە پێشەنگ
فەرامۆش کرێ کەسی بێ دەنگ
بەهاری ژیان هەر خەزانە
باخ هەر بەدەستی نەزانە
بێ دەنگە پڕ هاوارەکان
بۆیان دەگرین کاتێ نەمان

٨/٢/٢٠١٩

## بێ لایەن

مــن تێلــی نێــوان دوو تــای تــەرازووم
بــۆ یەکســـانییە هـــەوڵ و ئـــارەزووم
من هێمای راستم بۆ سەنگ و پاڵ سەنگ
مەڕواننــە دووتــامنم پــڕ لــە ســەنگ
هـــەر مـــنم ئـــاڵای دادو یەکســـانی
چــی بکــەم هــەردووتا کــە پێــی نــەزانی
لـــەم نێوانـــەدا لـــە خـــەمی دووتـــا
هــەر ســەر دەســوڕێ و نــابڕێ لــەرزوتا

٩/٢/٢٠١٩

## ئاوێنەی ژیان

لەهـــەرجێ و شـــوێنێ کـــە دەبیـــنم دار
دێتـــــەوە یـــــادم مامۆســـــتا باڵـــــدار
لەگــەڵ گوێبیســتی کــەرکوکی زامــدار
دەبـــێ بەمەشـــخەڵ ناوەکـــەی دڵـــدار
کـــە مێـــژوو بـــەبیر خـــۆم دەهێنمـــەوە
ئـــای چەنـــد دەبیـــنم دیمـــەنی ســـێدار
شـارو دێـی کـاول بـاخ و دێـی سـووتاو
هـــەزاران جـــەرگ ســـووتاو دەردەدار

ئێستاش لە باخچەی گوندو شارەکان
زۆرن ناوداری پیری دەست بەدار
لە کونجی ماڵ و گەڕەک و شەقام
زۆرن خەباتکار کەسی وەفادار
هەزاران زۆرن پەککەوتەی بێ هێز
کە بێ بژێوین بێ نەوت وبێ دار
زۆر کەسی دڵسۆز لەبیر چووینەوە
زاناو خاک پەروەر بیرمەندو ناودار
کاتیەتی دەسا چاوێ بگێڕە
بەیادی جاران کاکی پایەدار
وەرە مەیدانی خزمەتی میللەت
ژیانت هەر دەڕوا تۆی دەسەڵاتدار
خۆ گەر لە دونیاش گوێ بەهیچ نەدەی
لەولادا جگە لە خودای بێدار
وەڵامی کامیان تۆ ئەدەیتەوە
باڵدار یا دڵدار،دەردەدار،زامدار

٩/٢/٢٠١٩

لـــه نێــوانی دوو تـــاریکی و تـــەنیایی
له ناو رەحمی دایەگیان و ناخی گۆڕ
لـــەم نێوانـــە و مـــاوە کەمـــە تامـــایی
تا ئەتوانی لـە ژیان ببـە خەندەو خۆر
١٣/٢/٢٠١٩

با هەر فراوان بێ و جمـەی بێ زەوی
کـە دڵ خـۆش نـەبوو کـونجێ تاریکـە
لــە کـونجێ بـژی و بـەدڵ بسـرەوی
دنیـــا لــــەم کونجـــە درزێ باریکـــە
١٣/٢/٢٠١٩

# خۆشەویستی ئێمەو بولبول

تــــا خۆشەویســــتی دەربــــڕێ
ملــــی گــــوڵێ ناســــک دەبــــڕێ
بــــوار نــــادا گــــوڵی جــــوان
لــــەم تەمەنــــە کورتــــەی ژیــــان
تێــر بــێ مەســت بــێ بــەکامی دڵ
لــە چریکــەی بــە جۆشــی بولبــول
لــە خۆشەویســتی و مــاچی هــەنگ
ســەمای پەپولــەی رەنگــاو ڕەنــگ
ئــــەرێ بەئــــەنفالی گــــوڵان
کــــام خۆشەویســــتیە بــــۆ دڵان
کــێ لــــە ژیانــــا تــــەنیا جــارێ
بینیویــــەتی لــــە گــــولزارێ
بولبــــولێ گــــوڵ بقرتێنــــێ
بیڕوشــــێنێ، بیــــوەرێنێ
ســەیری ئــەو چــۆن بــۆی دەخــوێنێ
وەک لای لایــــە دەیخــــەوێنێ
لای ئــــەم عاشــــقە مانــــدووە
هــــەموو رۆژێ چــــواردەی دووە

١٤/٢/٢٠١٩

# چەتری خودایی

بــۆ پاراســتنمان لــە خــۆرو بــاران
چــەترێکمان بــۆ هــات لەلایــەن خــودا
لــەم هــەموو دەســتەی دەســەڵاتداران
ئاخ دەسـتێ نـەبوو ئـەم چـەترە هەڵدا
١٦/٢/٢٠١٩

هـــــەمووی دڵســــۆزترین باوكـــــەو
ڕۆح و گیانــــــــە ڕۆڵــــــــەكانی
بابــــەش ئاگـــای لــــە مــــاڵ نییـــەو
هـــەر هـــاوارەو بابمـــان كـــانی
١٦/٢/٢٠١٩

لـە ناڵـەی دایكی نیشـتمان بـاش گوێ بگرن وەفـاداران
دەڵــێ فریـا ڕۆڵـەكانم نەچمـە خانـەی تەمەنـداران
١٦/٢/٢٠١٩

# گفت و ئیمزا

جـاران گفتێکـی بـەدەم تـا مـردن دەمایـەوە
لـەم زەمانـەش زۆر ئیمـزا بـە فوویـەک سڕایەوە
ئیمـزاو مـۆر بـەدڵ نـەبێ پـەڕی سـپیە قەواڵـە
وەک نوێژی بێ دەست نوێژە هەرچەند بیکەی بەتاڵە
ئەی ئەگەر ئەم ئیمزایە بۆ چارەنووسی گەل بێ
پێویسـتە لەخۆشـیانا دڵ چەنـد بـە پەلەپـەل بـێ

١٧/٢/٢٠١٩

# ئاسوودەیی

دەبـێ نەترسـێ کەسـێ دوو ڕووبـێ
ڕۆژێ ڕووی ڕەشبێ و گۆج و گڕوو بێ
ئـەم ژیانـە کورتـە ئەوەنـدە دێنـێ
سـمێڵیش دانێـی کـەچووی بـۆ ڕدێنـێ
چانـدنی نـەمام سـانایە و بـێ گـرێ
بـەڵام چەند نـەمام دەگـاو بـەر دەگرێ
ببینـە پیـرو پەککەوتـەو گـۆڕێ
تـا هـەی لـەژیانا خـۆت لـێ نـەگۆڕێ
کێلـی گـۆڕێکی دڵسـۆزی نـاودار
زۆر بـاڵاترە لـە کۆشـکی زۆردار
ئاسـوودەی لـەژیان بـە پـاکی و راسـتی
لای خـەڵک و خـوداش تۆ خۆشەویسـتی

٢١/٢/٢٠١٩

## نیگاو مەی

کە بۆ خۆشی پەنا دەبەی بۆ مەی نۆشی
دەبێ تامی خۆشی چی بێ بەسەرخۆشی
نیگای پڕ جۆش بە ویستی دڵ کە پڕ هۆشی
خۆشتر نیە بینۆشی بۆ فەرامۆشی
٢٣/٢/٢٠١٩

کە لەمێژوو ورد دەبیەوە ورد ورد مێشکت ورد دەبێ
ئەوەی (گەل)ە سەربەخۆیە بەختەوەرە کورد نەبێ
٢٤/٢/٢٠١٩

شێتی فەرهەنگ و دیوان و تابلۆ و دەنگی شێتەکانە
بەرهەمی خەمی زۆرداری و ئەوین و جەرگ سووتانە
٢٥/٢/٢٠١٩

کە دڵ خۆشی چەند حەز دەکەی تەمەنی(نوح)ت پێ بدرێ
کە دڵ تەنگی بەئومێدی کە زوو(نەفخی سوور)ی بدرێ
٢٥/٢/٢٠١٩

سەیرە کەسێکی زیندانی بڵێ لەژیان ئازادی و بەس
کەچی لەناو ماڵەکەی خۆی بولبول بخاتە نێو قەفەس
٢٦/٢/٢٠١٩

ویستی بە گوڵ گۆڕێ (حاجی) و (نالی) و (وەفایی) داپۆشێ
نەیدۆزیەوە بێ ئومێدبوو پێشکەشی کرد بە ڕەشپۆشی
٢٠١٩/٢/٢٦

## دایە و بابە

بابە گیان دایەی شیرینم کە سەر سپیم کەم دەبینم
ئێستاش وەک کاتی منداڵی خەریکی نوزەو گرینم
کەسێ شک نابەم وەک ئێوە بەسۆز ژیرم بکاتەوە
خەون و وێنەو یادەکانتان کەمێک دڵم دەداتەوە
کە سەردانی گۆڕتان دەکەم دەکەومە دەریای خەیاڵێ
ئاسوودەم و وادەزانم تازە هاتوومەوە ماڵێ
بێ داک و باب وەک کەسێکی لە بیابانێ بێ سایەو ئاو
توخوا تا هەن خزمەتیان کەن بیانخەنە سەر سەروچاو
گیانەکەم تا گیان نەسپێرن هەست ناکەی تەنیاو بێ کەسی
دوای ئەوان هەر چۆن بژی تۆ مەلێکی نێو قەفەسی
٢/٣/٢٠١٩

ئەمڕۆ زنجیرو کەلەپچە لەهەست و بیرو دڵ دەدرێ
کاتێ سەرو دڵیش گیرا مرۆڤ وەک مەستێ ڕێ دەگرێ
٢/٣/٢٠١٩

زۆر برینی قوڵ ساڕێژبوو ئاگری گەورە کوژایەوە
جەرگ سووتاو دڵبریندار بێ چارەسەر مایەوە
٣/٣/٢٠١٩

کەلاستیکی کوژانەوە بووبە تاجی سەری پێنووس
بێ ئومێدبوو لە هەق نووسین لەئامانج و لەچارەنووس
٤/٣/٢٠١٩

ئەی چاوەکەم هەتا ئێستا چەند چاویلکەم بۆ گۆڕیوی
چییکەم کە جیاوازی ناکەی لەنێوانی سەگ و ڕێوی
٤/٣/٢٠١٩

پێنووسەکان رەنگاو رەنگ بوون نامدان هەمووی رەشیان نووسی
لەدوای هیلاکی و بەدبەختی نامانین رامان لەگەڵ مووسی
٤/٣/٢٠١٩

بەڵ ریککەون تاکو سەرکەون
مافی گەل بدەن ئارام بخەون
سەربەرز بژین ئاسوودە بمرن
تارێز لە نەوەو مێژووتان بگرن
٤/٣/٢٠١٩

گـــەر بخـــەوین وەکـــو یـــارانی ئەشـــکەوت
دەبـــێ کـــە هەڵســـاین مـــابێ پاشـــەکەوت
دوای سێســـــەد ســـــاڵ بێیـــــتەدەر لـــــەماڵ
نەتبـــەن بـــۆ دەنگـــدان بەبـــەڕکی بـــەتاڵ
٤/٣/٢٠١٩

سـەرمابوو لای وێنـەی ئـاگرێ وەسـتام وتیان ئەمـە رەسـمە
وتـم بـۆ ئـارامی دڵ و گـەرمی دەروونـم مـن بەسـمە
٥/٣/٢٠١٩

تـــــۆ کەڕاپـــــەڕی بـــــەخۆ نەویســـــتی
لـــــەپێناو گـــــەل و ئـــــاڵای سەربەســـــتی
هەرچەنـــدە ئـــەمڕۆ لـــەم ژیانـــە پەســـتی
بـــەڵام لای خـــەڵک و خـــوا خۆشەویســـتی
٥/٣/٢٠١٩

دڵ و ماڵ و نیشتمانت گەر خەم و شەڕی تێکەوێ
تۆ هەرچی بی هەر چۆن بژی ژیانت لەبەر چاو دەکەوێ
٦/٣/٢٠١٩
کلیلـی دەرگـەی دڵ و هەسـت تـەنیا لای خۆشەویسـتێکە
ئاســن و ئاســایی نیــە هــەر لــەدوور پێکەنینێکــە
٦/٣/٢٠١٩

رازی دڵـــــی بولبـــــول و هونـــــەر زانـــــێ
تـــــەنیا خـــوداو خـــودی خۆیـــان دەیزانـــــی
٦/٣/٢٠١٩

وتـــە لـــەئاو پیرۆزتـــرە کـــەئاگری شـــەڕ دامرکێنـــێ
لەهەست و دڵ و دەروونا گوڵی ناسک و جوان بڕوێنـێ
٨/٣/٢٠١٩

دڵـــێ لـــە ئـــامێزی دڵـــێ کەهـــەر گـــەش و بـــێ ئـــازارە
لای ئەم دڵە هەموو رۆژێ هەر جەژنـە و هەشتی ئازارە
٨/٣/٢٠١٩

هەرکــــــەس بــــــەجۆرێ لــــــەژیان دەڕوانــــــێ
کەســــــیش بــــــەدەردی کەســــــێ نــــــازانێ
ژیـــــان ئەگـــــەر تـــــەنیا رۆژ ژمـــــاردن بـــــێ
مـــــرۆڤ بـــێ باکـــە هـــەر کـــەی مـــردن بـــێ

١٠/٣/٢٠١٩

## دڵ و خاوەنەکەی

کرێکــارێکی بــێ پشــوو و بــێ خــەو
هــەر لەکاردایــە بــە رۆژو بــە شــەو
کرێکــەی خــــەم و ئـــازار و ژانــــە
کـــە دڵســـــۆزێکی زۆر بەســــتەزمانە
دەپارێتــــەوە کـــەمێ خۆشـــم کـــەن
بەس ئاوا پەست و وا رەشپۆشم کەن
دڵ و خـــاوەنی هـــەر لـــە گفتوگـــۆن
هەردووک زۆر خەفەت لەیەکتر دەخۆن
ئـــــەم کۆبوونــــەوەو دانوســــتاندنە
بـــێ کۆتـــاییەو هـەتـــا مــــــردنە

١٠/٣/٢٠١٩

## پێوەر

بۆ داهـاتوو هەرچەنـد نەخشـەی ورد داڕێژی
دەڵـێن گێـژی کـە گلۆڵـەت کەوتـە لێـژی
گــەلێ زانــا بــەرەو ئامــانجی کەوتــە ڕێ
لــەوێ بینــی نــەزان بــەگوڕ هەڵدەپــەڕێ
بــزانم یــا هێنـدەی هەســتم پــێ کردبــێ

کـەم زانـا هـەن لە سـایەی خۆشـیا مردبێ
کــەلای ســتوونێ کارەبــا دێــن و دەڕۆن
کــێ دیویــەتی وێنــە یــا نــاوی ئەدیســۆن
لــە بوونــەوە بــێ پێــوەرە ئــەم ژیانــە
بۆیــە حــاڵی زانــا هــەردەم دەردو ژانــە
١٤/٣/٢٠١٩

زۆرن ئەوانـــەی نـــاژین وەک پێویســـت
دوورن لەویســت و ســۆزو خۆشەویســت
لــــەناو خــــەیاڵ و لــــەچاوەڕوانی
دەڕوانــــی ڕۆژێ بگــــا بــــە ژیــــانی
١٤/٣/٢٠١٩

بــەدڵ لێــی پرســیم یــاری شــیرینم
چــۆنی چــی دەکــەی چۆنــت ببیــنم
وتــم بــەم گەنجیــە خانــە نشــینم
دایــەنی دڵــەی پــڕ لــە ئــەوینم
١٥/٣/٢٠١٩

خاک خەمگینە لەسەر سینەی بژاری دڕک و پووش ناکرێ
بایــەخ بــەگوڵ و بێســتان و داری بەرهەمــدار نــادرێ
١٥/٣/٢٠١٩

## ولآت و دەسەلآت

شـــوورەی قـــایم کۆشـــک و قـــەلآت
هێـــزو کورســـی و پـــای دەســـەلآت
فـــەردەی گـــەلآت خەزنـــەی تـــەلآت
بـــۆ ببـــێ بـــە دەردو بـــەلآت
خێـــر نـــەبێ بـــۆ گـــەل و ولآت
جـــا کـــەزۆر هـــات بلێـــن هـــەلآت
کـــەس نـــەبوو گیـــان کـــا بەخـــەلآت
ئۆخـــەی نـــەما رۆژمـــان هـــەلآت

١٦/٣/٢٠١٩

# مەرگی ئاواز

بۆ مەرگی مامۆستا سەرداری هونەرمەندی شاری کۆیەی رەنگین کە لە ٢٠١٩/٣/١٧ کۆچی دوایی کرد، سڵاو لە گیانی پاکی بێت و خودا بیبەخشێت و بەبەهەشتی رازاوەی شاد بکات کاتژمێر (١٠)ی شەو نووسراوە...

هونەرمەنـــدی زانـــاو لێـــزان
شـــا بولبـــولی بـــاخ و رەزان
مـــەرگت هەســـت و دڵـــی تـــەزان
بـــەهاری کـــۆ بـــوو بـــە خـــەزان
ســـۆزی گـــەرووە پـــڕ ناڵـــە کـــەت
دەنـــگ و ســـەدای شمشـــاڵەکەت
تـــا وەکـــو ژیـــان دەبڕێتـــەوە
لـــە گوێمـــان دەزرینگێتـــەوە
ئـــەی ســـەرداری بـــاب ســـەرداری
تـــۆش هـــەر وەک حـــاجی و دڵـــداری
لەشـــافەرهەنگی کوردســـتان
لـــەناو دڵـــی خۆشەویســـتان
لـــە ئاســـمانی شـــاری جوانـــت
لـــە یـــادی گشـــت هاورێکانـــت
وەک ئەســـتێرەکی گەشـــاوە

دەمێنـــــی تـــــا دونیـــا مــــاوە
شـــــێوەیاد شـــــایەنی تۆیـــــە
لــــە دەروازەی شـــــاری کۆیـــــە
گیانـــــت شـــادو خـــوا بتبەخشــــێ
گــۆڕت بـــەچراو گـــوڵ بنەخشـــێ
١٧/٣/٢٠١٩

وتەی چاک ئەوەی وتراوە تا ئەمڕۆش دەوترێتەوە
چەکوشێکی زێڕین بووە و ئاسنی سارد دەکوتێتەوە
١٧/٣/٢٠١٩

ئـــەمرۆ لەکۆیـــە هەســـتم کـــرد مـــەل و بولبـــولانی ســـەردار
هەمووی خامۆش بوون بۆ مەرگی سەرداری ڕێی هونەر سەردار
١٨/٣/٢٠١٩

## رۆژی پرسەی مامۆستا سەردار/کۆیە

دڵم گیرا بە زۆر شوێنی رازاوە و جوان و گەشتیاری
گەڕاینەوە هەستم نەکرد کەمێ کەمتر بێ ئازاری
وتم بۆ وا وتی دیارە بەکەسی مێشک و دەست بەستراو
هیچ ناکرێ تا دەوەستم لە ناو ژان و گۆمی خوێناو
١٨/٣/٢٠١٩

لەگەڵ سروودەکەی نەورۆز با ئاسمانی شار گڕ بگرێ
رۆژی نوێ و جەژنی ئێمە ئەو رۆژەیە کورد یەکبگرێ

٢٠/٣/٢٠١٩

لە پێش زایین بەحەوت سەدساڵ دەوڵەتی کورد ماد بووە
حەیفە ئێستا بۆ بژێوی گیرۆدەی بەغداد بووە

٢٠/٣/٢٠١٩

## بۆ مێژوو بەساکاری
## هەربژی کوردەواری

ئـەی رەقیـب لـە کـەرکوک نووسـرا
لـــە مـــەهاباد لـــە چـــوارچرا
ئـــاڵای کـــوردی پـــێ هـــەڵکرا
کـــە بـــە دڵـــدار راگەیەنـــدرا
لەشـــاری کـــۆ بـــەدڵ گریـــا
لـەدوای حـەفتاو چـوار سـاڵ بـرا
کـــە چەنـــد گیانیـــان لـــەرێ درا
چەنـــدان گـــەردن لـــە پـــەت خـــرا
زۆر لـــــە پێناویـــــان بەنـــــدکرا
وا لـــە کـــەرکوکی مـــاف خـــورا
ســـــرووودی دڵـــدار کـــپ کـــرا
ئـــاڵای راســـپاردەی پێشـــــەوا
دوو کـــــاتژمێر مۆڵـــــــەت درا

٢١/٣/٢٠١٩

دڵت خۆش بێ بە بەختیاریێ هەرچەندە خۆشت خەمباربی
دڵگران بە بەخەمباریێ با خۆت دڵخۆش و بەختیاربی
بۆ تەرم و گۆڕی بێ تاوان بۆ هەموو جەرگ سووتاویێ
چاوت داخەو سەر دانوێنە بەهەست و دڵ بگری تاویێ
٢٢/٣/٢٠١٩

جەستەی نازداری کوردستان تا ئەمرۆش خوێنی لێ دەتکێ
فریای کەون ئەگەر بمرێ خۆ هەڵدەواسن بە پەتکێ
٢٤/٣/٢٠١٩

لە کوێ دەمری دەڵێی توخوا تەرمم بەرنەوە کوردستان
بۆ یەک دەنگ و یەک ڕەنگ نابن خاک پەروەران خۆشەویستان
٢٤/٣/٢٠١٩

سەیرە هێندێ لە ژیانا تەنیا چرای ژیانی گەش بێ
باکی نیە روویی و مێژووی وەکو قیرو ڕەژوو ڕەش بێ
٢٤/٣/٢٠١٩

هەرچی بڵێین لە پێش ئێمە جوانتر وتراوە نووسراوە
بەڵام چەند گوێی لێ گیراوە چەندی کاری پێکراوە
وا هەست دەکەم زانا و دانا و هونەرمەند و رۆشنبیران
ئێستاو ئەوکات بەدڵ دەگرین بۆ رەنجی خۆیان ژیران
٢٦/٣/٢٠١٩

دەبا دەرچین لە بیری کورت با کار بکەین بۆ بیری کورد
بەیەک دەنگی بەدەست و برد با بۆ یەکتر ببین بە پرد
تەنیا کورد بین درشت و ورد وازبێنین لەئەوەی رابورد
دوایی لەو دیو سنوور نەڵێن ستەممان کرد وامان نەکرد
٢٧/٣/٢٠١٩

سەری گا لە کوپە گیر بوو گای سەربڕی و کوپەی شکان
گریـا وتـی گەر مـن بمـرم ئیتـر کـێ دێ بـە فریاتـان
٢٨/٣/٢٠١٩

سـی ئـەم مانگـە گۆڕەپـانی چوارچراتـان بێتـەوە یـاد
پـەتی گـەردنی پێشـەواو هاوڕێیـانی لـە مـەهاباد
ئینجـا لـە گشـت زامـەکانی ئـەم کوردسـتانە بـڕوانن
جا دەزانن بەیەک دەنگی و بە یەک ڕەنگی چەندە جوانن
٢٨/٣/٢٠١٩

بەیەکڕیزی کورد ڕێی مەرگی هەڵبژاردو کۆڕەوی کرد
ئێسـتا ئـازادن نـازانم بـۆ یـەکڕیز نـابن هێـزی کـورد
٣٠/٣/٢٠١٩

ڕێوی پزیشکی دارستان بوو هەر مەیمونێک نەخۆش دەبوو
مۆزی ڕاستی بۆ دەنووسی یەک بەیەک گیانی دەردەچوو
٣٠/٣/٢٠١٩

هەموو جەستەت ببێ بە دڵ جێی خەمی تیا نابێتەوە
درۆ خـولی کردۆتـەوەو وانـەی راسـتی دەڵێتـەوە
٣٠/٣/٢٠١٩

پێکەنینی کۆمبوونەکان خـەم دەبەخشێ و بە ئازارە
دڵـم پێی دێشێ ئەوەنـدەی کۆڕەوەکـەی ئـەم ئازارە
٣٠/٣/٢٠١٩

بـاوکێکی خـاوەن نـۆ منـداڵ هـەر نـاوی ئـەویان دەهێنـا
خۆی هەڵبژارد لەگەڵ دایکیان بە تەنیا دەنگی خۆی هێنا
٣١/٣/٢٠١٩

سمۆرە دەیان دارگوێزی بەهێزی چاندووە لەم خاکە
بێ سـەرمایە بـەم سـەرمایە عـەوداڵی کـەمێ خۆراکـە
٣١/٣/٢٠١٩

لـەم تەمەنـە چەنـد سـاڵیە حەیفـە لەبـەر پلـەو پۆستی
نە زووت لەبیربێ نە پیری نە مردن و خۆشەویستی
١/٤/٢٠١٩

چەندە بەرزە ئەو گڵکۆیەی لە گۆڕستان وەک چرایە
لای هەست دەکەی کە زیندووەو تەنیا بە جەستە نەمایە
١/٤/٢٠١٩

خەم و ئازاری گەلی کورد بەردو خشت و بلۆک بایە
دەبوو بەشا کۆشکی جیهان گەر لەسەریەک دابنرایە
١/٤/٢٠١٩

سالآنیکە چەندان ڕیژگەی دڵ و جەرگی مرۆڤی کورد
نەک ئاو خوێنی لەسەر دەرژێ زۆری مرد کەس باسی نەکرد
٢/٤/٢٠١٩

رۆژێ دادێ نەوەیەک دێ بەگریەو قوڕ پێوانەوە
مێژووی گەلمان دەنووسنەوە لە دێ و شارو کێوانەوە
٢/٤/٢٠١٩

چەند خۆشبەختی لەهەر کوێ بی ناوی گەل و نیشتمانت
گوێبیستی بی بەجۆرێ وا چرابێ بۆ رێگەی ژیانت
٣/٤/٢٠١٩

مێژوو دەڵێ یەکەم لانەی ژیان بووە کوردستانم
دڵگرانم گەنجێ بڵێ بێزارم وێڵی ژیانم
٣/٤/٢٠١٩

پیرۆزتـان بێت دەسـەڵات و سـەرۆک و پۆسـت و کابینـە
مـافی میللـەت چـی یـە حکومـەت زیاترمـان نـاوێ کابینـە
٣/٤/٢٠١٩

درۆ وەک تیشکی هاتوچۆ هەرجارە رەنگێ دەنوێنێ
وەک لای لایـەی نـاو نـوێنێ وا گـەنج و پیـریش دەنـوێنێ
٤/٤/٢٠١٩

ئەوەی کوردە چاوەڕوانی بەرپرسانی ئـەم هـەرێمـەن
بڵێن (بێکەس) گەیینە مەقسەد بێگانـە نۆکـەری ئێمـەن
٤/٤/٢٠١٩

کێلی شەهیدەکان رەنگ کـەن بـا نـەوەکان بیناسنەوە
ئـاوڕێ لەسیمای بێ رەنگی دایکی شـەهید بدەنـەوە
٥/٤/٢٠١٩

چـاوەڕوانی ڤیسـتیڤاڵی یـەک دەنـگ و یـەک رەنگـین هـەموو
تا بە جیهـان بڵێین کوردین یـەک ئـاڵاو یـەک سـەنگین هـەموو
٥/٤/٢٠١٩

مێشـکی زانـاو دانایـەکان بـە گشـتی دەستەوەسـتانن
گۆشـەگیرن لـە کونجێکـا چـاوەڕێی چرکـەی وەسـتانن
ژیـان هێنـدە تەماویـە رێـی هیـواو ئامـانج ناڕوونـە
هەمووی خەم و هیلاکیە ئەم هەوڵ و ئەم هـاتوو چوونـە
٧/٤/٢٠١٩

## بروسکەیەک لەچاڵی مەرگی سەماوەو شنگالەوە بۆ دڵسۆزانی کوردستان

یادی هەڵەبجە و ئەنفال و شەهیدانمان مەکەنەوە
زوو یەکبگرن کوردستان و دڵان ئاوەدان کەنەوە
ئەو دڵانەی لە هەشتاوهەشت و پێشتر پڕ ئاگرن
گڕو سووتانیان راگرن بەدڵ و گیان نازیان هەڵگرن
١٢/٤/٢٠١٩

## خوانەخواستە

درەختی خەباتی گەلم ئەوەندە کرمی تێدایە
بۆیە هەردەم کەم تەمەن و بێ بەرهەم و بێ گەڵایە
خوانەخواستە ئیمزایەکی جەزائیر رووبداتەوە
سەرانی کورد چۆن وەڵامی میللەتەکەی دەداتەوە
١٨/٤/٢٠١٩

کورسی دەسەڵات چەشنی قەپانە
کورت بێ درێژبێ لاواز خەپانە
باش نەبێ کێشی با بگاتە هەزار
سفرێکی رووتە هەرکە هاتە خوار
٢٠/٤/٢٠١٩

سـەد شـار مێروولـە لـەباخێ وێـران
دەژیـن بـێ کێشـەو دڵشـادن لـەژیان
ئێمـە لەسـێ شـار لـەوڵاتێکی جـوان
نـاتوانین بـژین چەشـنی مێـرووڵان
٢١/٤/٢٠١٩

## هاوارێ بۆ هەرێم

دەردی بێ خانی و بێ خاکی لای کرێچی و ئاوارەیە
خەمی هەژاری و نەبوونی لای بێ کارو بێ پارەیە
بەهای لەشساغی و خەوی خۆش لای نەخۆش و بێ چارەیە
ئاوێنەی جەرگ سووتاوان بازنەی پەتی سێدارەیە
چیرۆکی ناخ هەژێن لەلای دایکی دڵ پارە پارەیە
شا کتێبی مێژووی تاڵمان گۆڕەکانی ئەم خوارەیە
یادی رۆژانی خوێناوی لەناو دەنگی تەیارەیە
ماڵی کوردی ستەمدیدە هەرچۆن بێ ئەم دەوارەیە
بەهێزیکەن بیپارێزن کەسایەی ئەم چەند شارەیە
کاتێ نەما جا دەزانین چەند دڵگیربوو ئەم وارەیە
بۆ پەرپرسانی هەرێمە ئەم دەنگ و ئەم هاوارەیە
باش بزانن دوا دەرفەت لەژیانتان ئەم جارەیە
٢٤/٤/٢٠١٩

کــــه قاچـــت ئێشـــا مـــەڕۆ بەپەلـــە
جـوانترە بلــەنگی و پێــت بڵــێن شــەلە
پــرد هــەبوو لــەرووبار مــەدە بەمەلــە
کـــاتێ دەزانـــــی کەقـــەلیش مەلـــە
کـــەفڕی مـــەڵێ بزنـــەو کـــەی قەلـــە
٢٤/٤/٢٠١٩

کـــــاتێ دەنـــــازی بـــــەهێزو بـــــازووت
ورد ورد بڕوانـــــە دیمـــــەنی پیـــــرێ
گـەر بـەردەوام بـووی لەسـەر ئـەم نـازەت
بــرۆ ســـەر گــۆڕی گــەنجێک و میــرێ
٢٦/٤/٢٠١٩

هەنگ خاوەن دڵێکی وایە حەزدەکا بەردیش گوڵ بگرێ
کەلــە تــاوان پێــوەدەدا لــەداخانا یەکســەر دەمــرێ
٢٦/٤/٢٠١٩

## پەتی درۆ

دەڵــێن پــەتی درۆ کورتــە کــەچی زۆر درێــژە لێرانــە
کام جێت دەوێ دەگاتە وێ وەک جادەی نێوان شارانە
لە هێندێ ئاهەنگ و بۆنەش دەکرێ بەڕست و جۆللانە
پەتی راستی لەبەر کورتی کەم بەکاردێ لەم زەمانە
بەڵام لای راست و دڵپاکان بەم کورتیە بەنرخ و جوانە
٢٦/٤/٢٠١٩

لەوەتەی هەین تا ئەمڕۆ بەدڵنیایی
جێگەی داخە کەیەکدەنگی و تەبایی
لەناومانا کزەو کەم بەدی دەکری
میللەتێکین دەژین لەخانووی بەکری
٢٧/٤/٢٠١٩

خۆزگە حوکمەت وەک شفتی با میللەت بەشەرت بیکڕیبا
ئەگەر سوورو شیرین نەبا بەناوی عەردی دادابا
٢٨/٤/٢٠١٩

## کەری هاوکار(*)
## (١٩٦٣ – ٥٦ - ٢٠١٩)

لە ساڵی شەست و سێ دەرچوو فەرمانی گرتنی کەران
بەسەدان کەری بەستەزمان لەم شارە گیران بەندکران
تاوانبارب‌وون بەباربردن بۆ هاوکاری شۆڕشی کورد
دەیانزانی کەر خزمەتی پێشمەرگەو دێهاتی دەکرد
خاوەن کەر بۆ ئالیکدان و چاوپێکەوتن و سەردانی
لەترسی مەئموری کەران نەیدەتوانی بەئاسانی
شەوێ کەر دەچێتە خەونی بەدرەددین عەلی پارێزگار
جوتەیەکی وای لێدەدا رادەپەڕێ دەم بەهاوار
بۆ بەیانی فەرمان دەدا ئەوەی کەرە ئازاد بکرێ
ئەم دیمەنە چ سەیرێکە هەزار کەر پێکرا بەربدرێ
بۆ ئەم یادەو وەک وەفایەک بۆ ژیانی زیندانی کەرێ
هەقە بۆ کەر دروست بکرێ لەشوێنێکی شیاو پەیکەرێ
٢٩/٤/٢٠١٩

---

(*) ئەم بەسەهاتە ساڵی (١٩٦٣)بووە لە هەولێر کە بەدرەددین عەلی پارێزگار بووە

هەتا باس هەر باسی هێزبێ کێ پاڵەوان و دەسترۆیە
ئاشتی و تەبایی و برایی بێ بنەمایەو درۆیە
٢٩/٤/٢٠١٩

## کرێکارو یەکی ئایار

من هەموو رۆژێ نەک یەکی ئایار
لەناو دڵۆپە ئارەقی کرێکار
پەلکە زێرینەی رەنگین دەبینم
کە تیشک و هێزە بۆ رێگەی ژینم
ئەم هیلاکییە پڕ لە پاکییە
ئەم ماڵە سادەو ژیانە خاکییە
دڵی ئارام و سەربەرزی لەژیان
خەوی قوڵ و خۆش تا بەری بەیان
دەرگەی کراوە بەبێ پاسەوان
سینە فراوان بۆ خزم و مێوان
خەمی گەورەی ئەو بەس بێکارییە
کار هەبی ژیانی هەر بەختیارییە
جەژنتان پیرۆز جەستە ماندووەکان
ئێوەن بنیادنەر بزوێنەری ژیان
ساغ بن هەمیشە بازوو بەهێزبن
لەسەر شانۆی ژیان بەرزو بەرێزبن
٢٠١٩/٤/٣٠

# ئاوێنەی مەرگ و ژین

کەسێ ببێ و بژی دەبێ هەر تاڵی مەرگ بچێژێ
کەنادیارە تۆ چۆن دەمری لەچ کات و سات و ڕۆژێ
ئیتر وا ئاشکراو ڕوونە مردن لە ڕێی هەموومانە
هەرچی بی تۆ هەر چۆن بژی دوا ڕۆژت هەر نەمانە
جا دەسەڵاتدار ساماندار کەبەرەو مردن ڕێ دەگری
گەر زووش نەمری بێ هێز دەبی و بێ گۆچان خۆت ڕاناگری
لێگزس و ئۆپل و فیات دەبێتە عارەبانەیەک
دەستی بێ سۆزێ لێت دەخورێ بۆتۆ نا بۆ چەند عانەیەک
دڵنیابن کەم تەمەنمان ئەمرۆکە دەگاتە هەشتا
بۆ دووربی لە کاری چاک و لەخاک و خەڵک و بەهەشتا
پێش گۆچان و عارەبانەو سەفەری ئەڵمانیا و لەندەن
پێش ئەوەی خزم و خێزان و پزیشکان دەستت لێ بەردەن
پێش ئەوەی لەپاشی مەرگت بەرەژوو مێژووت بنوسرێ
کەس و نەوەت کەس حەز نەکا ناوت بێ و بەتۆ بناسرێ
وەرە لەپێش ئەم هەڵدێرە ئاڵای پاکی هەڵدە لێرە
دڵ و دەستت بکەرەوە ئەگەر وەفایە گەر خێرە
خوداو گەل پشتیوانت بێ ئاسوودەی لێرەو لەولادا
ئەگەرنا وەک نەبوونێکی پلەو سامان دادت نادا

٢٠١٩/٥/١

کەسێ ئاکاری لەژیانا خۆگری و خۆخۆریە
لەچاوی خەڵک و مێژوودا بێژنگی بەر خۆریە

٢٠١٩/٥/١

مرۆڤی هەستیار بەوتەیەک سەرو دڵی گێژ دەبێ
هەر بە وتەیەک گەش دەبێت و برینی سارێژ دەبێ
زمان کلیلە چەکوشە چەقۆیە دڕکە گوڵە
هۆی گریان و پێکەنین و خۆشی و ناخۆشی دڵە
٢٠١٩/٥/٢

لەنێوانی چەند رەنگان رەنگمان نەما
ئەوەندەی هاوارمان کرد دەنگمان نەما
چارەنووسمان کراوە بە میکانۆ
رێکی دەخەن تێکی دەدەن ئاخر بۆ
٢٠١٩/٥/٢

چەندساڵ لە هەوڵ و چاوەڕێ تا لە کرێچییەتی رزگاربی
جا خانویێ بێ تاپۆت بێ و پڕ درزو دڵۆپەو شێدار بێ
٢٠١٩/٥/٣

دڵ و مێشکی ئەوانەی ورد دەفامن
لە خەویشا بێ حاڵ و نائارامن
دڵ نەوەک چوار چل پارچەبێ لێرانە
بەستەزمانەی هەر تەنگەو ماڵ وێرانە
٢٠١٩/٥/٤

جوتیارێکین لەم ژیانە گشت لە کارین و دەچێنین
دڵنیانین لەچنینەوەی بەرهەمەکەو چی دەبینین
٢٠١٩/٥/٥

## خەو

بەم کاتە درەنگەو بەم شەوە
چەند کەس عەشقی تۆزێ خەوە
بەهیچ خەوی لێ ناکەوێ
دڵەی پڕ ژانی ناسرەوێ
بۆ هاوبەشی بۆ هاو هەستێ
خەریکە دڵی دەوەستێ

٢٠١٩/٧/٦

## زەنگ

زۆرن مناڵی کوردی بێناز چاوەڕێن بۆ مەکتەب هەڵێن
بێ مووچانە و پێداویستی سروودی (ئەی ڕەقیب) بڵێن
لەگەڵ هەر هەنگاوێکیان جەرگ و دڵی بەخێوکاران
زەنگی فریا لێدەداتن بۆ دڵسۆز و وەفاداران

٢٠١٩/٨/٢١

## جۆلانەی ژیان

بەرامبەر ژیان و دواڕۆژمان دڵ دەلەرزی مێشک بەزی
ددان پەنجەی دەست دەگەزی چۆن بیر لێدەدرێ بە دەرزی
لە هاوین جەستە دەبرژێ و لە کاتی سەرما دەتەزی
جۆلانە چۆن هەڵدەواسرێ لە لکەداری پیرو ڕزی
کە دڵنیای لەگەڵ پاڵێ دەماودەم دەکەویە ئەرزێ

٢٠١٩/٨/٢١

# نووسەر لە چەند دێڕێکدا

- ناو: کازم عەبدوڵڵا توفیق
- ساڵی لەدایک بوون: شاری کۆیە) ١٩٥٧
- ساڵی (١٩٧٣ – ١٩٧٤) ئامادەیی پیشەسازیی تەواو کردووە.
- ساڵی(١٩٧٤) وەک فەرمانبەرێکی حکومی
- دامەزراوم ئێستا مامۆستای تەکنیکیم لە پەیمانگەی تەکنەلۆجی هەولێر – بەشی ئامێرەکانی پترۆڵ.
- ئەندامی یەکێتی نووسەرانی کوردم – لقی هەولێر
- ئەندامی سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستانم.

# بەرهەمە چاپکراوەکانی شاعیر

١. دوای راپەرین، ١٩٩٤، هۆنراوە لەسەر بارودۆخی ئەوکات.
٢. کەوەکەم، ١٩٩٤، هۆنراوەی منداڵان.
٣. هەڵۆ، ١٩٩٦، هۆنراوەی منداڵان.
٤. جۆلانە و سێدارە، ١٩٩٦، هۆنراوەی جیاجیا.
٥. گوڵزاری منداڵان، ١٩٩٨، هۆنراوەی منداڵان.
٦. ساڵنامەی کوردی، ٢٦٩٨.
٧. ساڵنامەی کوردی، ٢٦٩٩.
٨. ساڵنامەی کوردی، ٢٧٠٠.
٩. ئامۆژگاری و هێماکانی هاتوچۆ، ٢٠٠٠.
١٠. منداڵی ژیر، ٢٠٠٠، پۆستەر، هۆنراوە.
١١. گەشتی دارستان، ٢٠٠٠، ب١، هۆنراوەی منداڵان.
١٢. پۆستەری کوتانی پزیشکیی تایبەت بە دایک و منداڵ، ٢٠٠٠.
١٣. تەرمی تیشک، هۆنراوە، ٢٠٠٠.
١٤. مافەکانی منداڵ، ٢٠٠١، پۆستەر، هۆنراوە.
١٥. ساڵنامەی کوردی، ٢٧٠٢.
١٦. گەشتی دارستان، ٢٠٠٠، ب٢، هۆنراوەی منداڵان.
١٧. هەندەران و هەواری من، ٢٠٠٢، هۆنراوە.
١٨. چەتری هەناسە، ٢٠٠٣، هۆنراوە.
١٩. مافەکانمان، ٢٠٠٣، پۆستەر، هۆنراوەی منداڵان.
٢٠. شانۆی ژیان، ٢٠٠٣، پۆستەر، هۆنراوە تایبەت بە کەمئەندامان.
٢١. قوتابی و هاتوچۆ، ٢٠٠٣، هۆنراوە و رێنمایی بۆ منداڵان.

٢٢. ساڵنامەی کوردی، ٢٧٠٤.
٢٣. گەشتی دڵان، ٢٠٠٤، هۆنراوە.
٢٤. ئۆپەریتی تالاسیما، ٢٠٠٤، هۆنراوە.
٢٥. ساڵنامەی کوردی، ساڵی ٢٧٠٥.
٢٦. هاواری هەست، هۆنراوە، ٢٠٠٥.
٢٧. ئاوێنەی شارستانی، ٢٠٠٥، هۆنراوەی منداڵان.
٢٨. خۆشەویستەکانم، ٢٠٠٥، هۆنراوەی منداڵان.
٢٩. بخوێنن، ٢٠٠٥، هۆنراوەی منداڵان.
٣٠. تیشکی ژیان، ٢٠٠٥، هۆنراوەی منداڵان.
٣١. مۆمی پەپوولەکان، ٢٠٠٥، هۆنراوەی منداڵان.
٣٢. دیوانی نەوەکانی چریکەی دوارۆژ، ٢٠٠٦، هۆنراوەی منداڵان، کۆکراوە، چاپی یەکەم.
٣٣. ساڵی کوردی، ٢٠٠٦، هۆنراوەی منداڵان.
٣٤. توانەوە، ٢٠٠٧، هۆنراوە.
٣٥. دیوانی نەوەکانی چریکەی دوارۆژ، ٢٠٠٧، هۆنراوەی منداڵان، کۆکراوە، چاپی دووەم.
٣٦. ئاوازی خەو، ٢٠٠٧، هۆنراوە.
٣٧. سۆمای هەست، ٢٠٠٧، هۆنراوە، کۆکراوە.
٣٨. بەزم و رەزمی منداڵان، هۆنراوەی منداڵان، مامۆستای هونەرمەند (ئامانج غازی)، بە نۆتەو مۆسیقا و هەردوو رێنووسی کوردی و لاتینی ئامادەی کردووە، ٢٠٠٧.
٣٩. ساڵنامەی کوردی، ٢٧٠٨.
٤٠. یاریی بەسود بۆ منداڵان، ٢٠٠٨، پۆستەر.
٤١. کاوەو نەورۆز، ٢٠٠٨، هۆنراوەی منداڵان.
٤٢. رێوی و گورگ و تەڵە، ٢٠٠٨، هۆنراوەی منداڵان.
٤٣. سروشتی جوان، ٢٠٠٨، هۆنراوەی منداڵان.

٤٤. وتەی درەخت، ٢٠٠٨، هۆنراوەی منداڵان.
٤٥. سروودی خۆشەویستی خوێندن، ٢٠٠٩، هۆنراوە، تایبەت بە قوتابخانەکان.
٤٦. زەنگوڵەی کاریلەکان، ٢٠٠٩، چیرۆکی منداڵان.
٤٧. شانۆی دەنگە ناسکەکان، ٢٠٠٩، هۆنراوەو ئۆپەرێت بۆ منداڵان.
٤٨. ئازاری فام، ٢٠١٠، هۆنراوە.
٤٩. ژانی بێ ژوانی، ٢٠١٠، هۆنراوە.
٥٠. ئازاری فام و ژانی بێ ژوانی، ٢٠١١، هۆنراوە، کۆکراوە.
٥١. سایەی زانین، ٢٠١١، هۆنراوەی منداڵان.
٥٢. پیاسەیەک و هەناسەیەک، ٢٠١٥، هۆنراوە، کورتەیەک لەژیاننامە، کاروچالاکیەکان.
٥٣. بەهای ناخ، ٢٠١٨، هۆنراوە.
٥٤. تا هەی گوڵ بە، ٢٠١٨، هۆنراوە.
٥٥. دڵ و ژیان، ٢٠١٩، هۆنراوە، ئەم نامیلکەی بەردەستت... بەهیواین جێگەی رەزامەندیتان بێت... لەگەڵ رێزمدا.

کازم کۆیی
٢٠١٩/٨/٣٠ هەولێر

